کورتەی



# بەشەکانی باوەڕ

٧

القرآن والسنة

دانەر

مسلم ١٤١٨هـ-١٩٩٧م

# کورتەی

# بەشەکانی

# باوەڕ

٧

القرآن والسنة

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره ونتوب إليه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له. واشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، واشهد أن محمدا عبده ورسوله، وصلى الله عليه وصحبه وسلم تسليما كثيرا.

(***يا أيها الذين آمنوا أتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون***) آل عمران/١٠٢...(***يا أيها الناس أتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساءا واتقوا الله الذي تساءلون به والأرحام إن الله كان عليكم رقيبا***) النساء/١...(***يا أيها الذين آمنوا أتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما***)الأحزاب/٧٠.

اما بعد: فان أصدق الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار. وبعد:

## پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد المرسلين وأتباعه المخلصين أجمعين.

مرۆڤ بە هۆی ڕووناکی باوەڕەوە بەرەو باڵندترین پلە بەرز دەبێتەوە. بەمەش نرخ و بایەخێکی ئەوتۆی دەست دەکەوێت کە وای لێ دەکات شایانی بەهەشت بێ. بەڵام ئەگەر ڕێگای کوفر بگرێتە بەر، ئەوا بەهۆی ئەو تاریکی‌یەی کە لەو ڕێگایەدا هەیە، بەرەو نزمترین پلە دادەبەزێتە خوارەوە، ودەکەوێتە بارێکی ئەوتۆ کە وای لێ دەکات شیاوی دۆزەخ بێ.

هۆی ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ((باوەڕ) بە پەیوەندیەکی پتەو، مرۆڤ بە خوای خۆیەوە دەبەستێت و پەیوەندی لەگەڵ خوای گەورەدا بۆ پەیدا دەکات، چونکە باوەڕ لە ڕاستی‌دا، پەیوەندی پەیدا کردنە لەگەڵ خوای گەورەدا. جا لەو ڕووەوە کە: ((مرۆڤ دەستکردی خوای کردگارەو، نیشانەی نەخش و نیگاری ناوە جوانەکانی پەروەردگاری تێدا دەردەکەوێ)) ئەوا بە

هۆی باوەڕەو، مرۆڤ نرخ و ڕێزێکی تا بڵێی گەورەی دەست دەکەوێ.

بەڵام کوفر ئەو پەیوەندی و نیسبەت پەیدا کردنە دەپچڕێ، تاریکییەکەشی ئەو دەستکردەی خواوەندی کردگار دا دەپۆشێ و نای هێڵێ.

بەم کارەش لە نرخی مرۆڤدا دەگرێ و تەنها لە لایەنە مادییەکەی دەی هێڵێتەوە خۆ ماددەش، لەبەر ئەوەی شتێکی فانییە و لە ناو چووە و ژیانیش کاتییە، ئەوا بایەخی بۆ دانانرێ و وەك نەبوو وایە.

## ڕاێ خۆشکردن

بەڕێزان............

ئەم نامیلکەیەی بەردەستتان (**بەشەکانی باوەڕ**)تان بەر دەست نیشان دەکات بەهیوای زیاتر ئاشنا بوونی موسوڵمانانی بەڕێز لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و خزمەت کردنی لە لایەن ئێمەوە بۆ ئاوەی بتوانین جارێکی‌تر لە ژێر سایەی قورئانی پیرۆز بحەسێینەوە، هیواداریـن خودای میهرەبان پاداشتی خێری هەموو لایەك بداتەوە، وخوێنەرانی بەڕێزیش سوودی لێ وەربگرن و لە دوعای خێر بێبەشمان نەکەن ﴿***إن أريد إلا الإصلاح ما استطعت وما توفيقي إلا بالله عليه توكلت وإليه أنيب***﴾.

٢٨/جمادى الأولى/١٤١٨

ئاوانێر

## سەرنجێک

ئێمە مەبەستمان لە دانانی ئەم نامیلکەیەی بەردەستان بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای کردگارە و شارەزا بوونی موسوڵمانان لەسەر بە شەکانی باوەڕ. بۆیە هەریەکەو بەڵگەیەکمان هێناوەتەوە تا بگات بە دەستی مسوڵمانان وە سوودمان وەرگرتووە لە پەرتووکی (*مختصر شعب الإيمان*) بە پێنوسی (*امام قزويني*).

## پێناسەی باوەڕ

*جێگربوونە لە دڵ دان پێداهێنانە بە زوبان دەربڕینە بە کردەوەوە.*

## سەرەتایەك بۆ بەشەكانی باوەڕ

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿**الايمان بضع و سبعون شعبة فافضلها قول لا إله إلا الله وادناها إماطة الاذى عن الطريق والحياء شعبة من الأيمان**﴾ أخرجه الامام احمد و مسلم وأبو داود والنسائي وإبن ماجه.

واته (باوەڕ حەفتاو هەندێك بەشە لەهەموویان بەرزتر ووتنی (**لا إله إلا الله**)یە وە بچوك ترینیشیان لابردنی كۆسپێكە لەسەر ڕێگا و شەرم و شكۆش بەشێكە له باوەڕ.

ئەم فەرمودەیە بە شێوەیەكی تریش هاتووە .

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال، قال رسول الله(ﷺ)﴿**الايمان بضع وستون شعبة أعلاها أو فارفعها قول لا إله إلا الله وأدناها إماطة الاذى عن الطريق والحياء شعبة من الايمان**﴾ أخرجه البخاري وإبن حبان .

## بەشەکانی باوەڕ

**١- باوەڕ هێنان بە خـــوا:**

﴿*والمؤمنون کل آمن بالله*...﴾البقرة/٢٨٥.

واتە: (باوەڕداران گشتیان باوەڕیان بە خوا هێناوە).

**٢- باوەڕهێنان بە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ):**

**٣- باوەڕهێنان بە فریشتەکانی خوا:**

**٤- باوەڕهێنان بە پەرتووکە ئاسمانیەکان:**

﴿*والمؤمنون کل آمن بالله وملائکته وکتبه ورسله*﴾ البقرة/٢٨٥.

واتە: (باوەڕداران هەموویان باوەڕیان هێناوە بە خوا و فریشتەکان و پەرتووکەکان و پێغەمبەران).

**٥- باوەڕهێنان بە قەزا و قەدەر لە ڕووی چاکە و خراپـەوە هـەر لە لای خوداوەیە:**

﴿*إنا کل شيء خلقناه بقدر*﴾ القمر/٤٩.

واتە: (بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە گیری (قەدەر)

دروست کردووە).

﴿قل کل من عند الله﴾ النساء/٧٨.

واتە: (پێیان بڵێ ئەی موحەمەد (ﷺ) هەموو شتێك چاکە و دراپە لە لای خواوەیە).

**٦- باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی:**

﴿قاتلوا الذین لا یؤمنون بالله ولا بالیوم الآخر﴾ التوبة/٢٩.

واتە: (ئەو کەسانە بکوژن کە باوەڕیان بە خواو ڕۆژی دوایی نییە).

**٧-باوەڕهێنان بە زیندو بوونەوە، لە پاش مردن:**

﴿زعم الذین کفروا ان لن یبعثوا قل بلی وربي لتبعثن ثم لتنبئن بما عملتم﴾ التغابن/٧.

واتە: (بێ بڕواکان گومانیان برد کە لە (ڕۆژی دوایی)دا زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ (ئەی پێغەمبەر) نەخێر وانییە بە خوا زیندوو ئەکرێنەوە، پاشان ئاگادار ئەکرێن بەوەی کردووتانە).

**٨- باوەڕهێنان بە کۆکردنەوەی خەڵکی (حەشرکردن) لە دوای زیندوو بوونەوەیان:**

﴿*الا يظن اولئك أنهم مبعوثون*لیوم عظيم *يوم يقوم الناس لرب العالمين*﴾ المطففين/٤-٦.

واتە: (ئەوە وا گومان نابەن بەرامبەر بە زیندوو بوونەوە، بۆ ڕۆژێکی گەورە کە قیامەتە، لەو ڕۆژەدا هەموو خەڵکی دێن بەرەو لای پەروەردگار بۆ حیساب کردن).

**باوەڕهێنان بە وەی کە شوێنی باوەڕداران بەهشتەو شوێنی بێ باوەڕانیش ناو ناگرە:**

﴿*بلى من كسب سيئة وأحاطت به خطيئته فاولئك أصحاب النار هم فيها خالدون والذين آمنوا وعملوا الصالحات اولئك أصحاب الجنة هم فيها خالدون*﴾ البقرة/٨١-٨٢.

واتە: (هەر کەسێك گوناهی گەورە بکات و لە هەموو لایەك دەوری بدات ئەوا ئەو کەسە هاوڕێی هەمیشەیی ناگرە و بە بەردەوامی تێیدا ئەمێنێتەوە، ئەوانەی باوەڕیشیان هێناوە و کردەوەی چاك ئەنجام ئەدەن، ئەوا هاوڕێی هەمیشەیی بەهشتن بە بەردەوامی (نەمری) تێیدا ئەمێننەوە).

**١٠- باوەڕ بوون بە هەبوونی خۆشەویستی بۆ خوا:**

﴿....والذين آمنوا أشد حبا لله﴾البقرة/١٦٥

واتە:ئەوانەی باوەڕیان هێناوە خۆشەویستیەکی زۆریان هەیە بۆ خوا.

**١١- باوەڕ بوون بە هەبوونی ترس لە خوا:**

﴿فلا تخافوهم وخافون إن كنتم مؤمنين﴾ آل عمران/١٧٥.

واتە: (لە بێ بڕواکان مەترسن لەمن بترسن ئەگەر ئێوە بڕوادارن).

**١٢- باوەڕ بوون بە تکا کردن لە خوا:**

﴿ويرجون رحمته ويخافون عذابه﴾ الإسراء/٥٧.

واتە: (چاوەڕوانی میهرەبانی خوان و دەترسن لە سزاکەی).

**١٣- باوەڕ بوون بە پشت بەستن بە خوا:**

﴿وعلى الله فليتوكل المؤمنون﴾ آل عمران(١٢٢-١٦٠).

واتە:(با بڕوا داران هەر بە خوا پشت ببەستن).

**١٤- باوەڕ بوون بە خۆش ویستنی پێغەمبەر(ﷺ):**

﴿لايؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من ولده والناس أجمعين﴾متفق عليه.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ:﴿باوەڕی هەر یەك لە ئێوە تەواو نابێت

هـــەتا وەکـــو منتـــان خۆشـــتر نـــەوێت لـــە منداڵـــەکانتان و هەمووخەڵکانیتر﴾.

**١٥-باوەڕ بوون بـــەڕێزگرتن و یارمـــەتی دان و ســـەر خســـتنی پێغەمبەر(ﷺ):**

﴿*فالذين آمنوا به وعزروه ونصروه...*﴾ الاعراف/١٥٧.

واتـە: (ئەوانـەی باوەڕیان پـێ هێنـاوەو بە بەڕێزو گەورەی دەزانـن و یارمەتیشی دەدەن...).

**١٦- باوەڕ بوون بەوەی چۆن پێت ناخۆشە بتخەنە ناو ئـاگر دەبێ ئاواش پێت ناخۆش بێت لـە ئیسـلام هەڵگەڕێیتـەوە. هەروەکو لەو فـەرموودەدا هـاتووە:** ﴿*ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الايمان ثم قال وان يلقى في النار أحب إليه من أن يرجع الى الكفر بعد أن انقذه منه*﴾ متفق عليه عن أنس

واتە: (سێ خەسلەت هەن کە لە یەکێك بێتە جێ ئەوا تامی باوەڕی چێشتووە یەك لەوانە، هەڵگەڕانەوەی لە ئایین ئەوەند پێ‌ناخۆش بێت هەروەکو چۆن پێی‌ناخۆشە بیهاوێنە ناو ئاگر).

**١٧- بـــاوەڕ بـــوون بـــە داوا کـردنی زانست**

﴿يرفع الله الذين آمنوا منكم والذين أوتوا العلم درجات﴾ المجادلة/١١.

واتە: (خوا پایەی ئەو کەسانە بەرز ئەکاتەوە لە ئێوە کە بڕوایان هێناوە، وە ئەوانەی کە زانست وزانیاریان پێ بەخشراوە بە چەند پلەیەك بەرزیان ئەکاتەوە).

**١٨- باوەڕ بوون بە ڕاگەیاندنی زانست:**

﴿لتبيننه للناس ولا تكتمونه﴾ آل عمران/١٨٧.

واتە: (بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوەو مەی شارنەوە).

**١٩- باوەڕ بوون بە پیرۆز زانینی قورئان:**

﴿إنه لقرآن كريم في كتاب مكنون﴾ الواقعة٧٧-٧٨.

واتە: (بە ڕاستی قورئان خاوەن ڕێزە. نوسراوەتەوە لە کتابێکی پارێزراو).

**٢٠- باوەڕ بوون بە پاك و خاوێنی:**

﴿الطهور شطر الايمان﴾رواه مسلم.

واتە: (پاك وخاوێنی نیوەی باوەڕە)

**٢١- باوەڕ بوون بە نوێژ:**

﴿*إن الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتا*﴾ النساء/١٠٣.

واتە:(بێگومان نوێژ لە سەر باوەڕداران فەرزێکی کات دیاری کراوە).

**٢٢- باوەڕ بوون بە زەکات:**

﴿*وأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة*﴾ البقرة/٤٣.

واتە: (نوێژەکانتان بەجێ بگەێنن و زەکاتیش بدەن).

**٢٣- باوەڕ بوون بە بەڕۆژوو بوون:**

﴿*ياأيها الذين امنوا كتب عليكم الصيام*﴾ البقرة/١٨٣.

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووبوونتان لە سەر نوسراوە و فەرزکراوە).

**٢٤- باوەڕ بوون بە مانەوە لە مزگەوت(ماڵی خوا):**

﴿*وعهدنا الى ابراهيم واسماعيل ان طهرا بيتي للطائفين والعاكفين والركع السجود*﴾ البقرة/١٢٥.

واتە: (بە ئیبراهیم و ئیسماعیلمان ڕاگەیاند کە ماڵی من (کەعبە) لە بت وسەنەم پاک بکەنەوە بۆ ئەو کەسانەی زیاردتی دەکەن و تیایدا

دەمێننەوە و ڕکوع و سوژدە دەبەن).

٢٥- **باوەڕ بوون بە حەج کردن:**

﴿*ولله على الناس حج البيت من استطاع اليه سبيلا*﴾آل عمران/٩٧.

واتە: (خوا لە سەر خەڵکی داناوەو فەرزیکردووە کە بچن بۆ زیارەتی کەعبە ئەگەر لە توانایاندا بوو).

٢٦- **باوەڕ بوون بە جیهاد کردن:**

﴿*وجاهدوا في الله حق جهاده*﴾ الحج/٧٨.

واتە: (تێبکۆشن بۆ خوا بە تێکۆشانێکی ڕاست ودروست).

٢٧- **باوەڕ بوون بە خۆ ئامادەکردن:**

﴿*عن سهل بن سعد الساعدي ﷺ قال: رباط يوم في سبيل الله خير من الدنيا وما فيها*﴾ رواه البخاري.

واتە: (خۆ ئامادەکردنی ڕۆژێك لە پێناو خودا چاکترە لە دونیا و ئەوەی تیایەتیشی).

٢٨- **باوەڕ بوون بە وەستان بەرامبەر بە بێ بڕوایان و ڕانەکردن لە کاتی ترس و تەنگانەدا:**

﴿*يأيها الذين آمنوا اذا لقيتم الذين كفروا زحفا فلا تولوهم الأدبار*﴾ الأنفال/١٥.

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە گەر گەیشتن بە بێ بڕوایان وکافران لە جەنگدا، بۆتان هاتن، پشتیان تێ مەکەن و هەڵمەیەن).

**٢٩-باوەڕ بوون بە دابەش کردنی غەنیمەت:**

﴿*واعلموا انما غنمتم من شيء فان لله خمسه وللرسول ولذي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل إن كنتم آمنتم بالله وما انزلنا على عبدنا*﴾ الأنفال/٤١.

واتە: (بزانن ئەوەی دەستتان دەکەوێ لە ماڵ وسامانی بێ بڕواکان، پێنج یەکی بۆ خوایە و بۆ پێغەمبەرە (ﷺ) و بۆ خزمی نزیك و هەتیو و هەژار و رێبوارە بێ نەوا و داماوەکانە، گەر ئێوە باوەڕدارن بە خوا و بەوەی کە ناردوومانەتە خوارەوە).

**٣٠- باوەڕ بوون بە ئازادکردنی بەندە لە پێناوی خوا:**

﴿*فلا اقتحم العقبة وما أدراك ما العقبة فك رقبة*﴾ البلد ١١،١٢،١٣.

واتە: (هێشتا ئادەمیزاد پلەی سەختی نەگرتۆتە بەر، تۆ چووزانیت

ئەو پلە سەختیە کامەیە، ئازاد کردنی بەندەیە).

**٣١- باوەڕ بوون بە بەجێ هێنانی سزای تاوانەکان(کەفارەتی تاوان و گوناهەکان):**

(ئەمەشیان قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێشەوامان(ﷺ) جۆری سزاکە دیاری دەکەن. هەر تاوانێك سزایەکی دیاری کراوی خۆی هەیە).

**٣٢- باوەڕ بوون بە بەجێ گەیاندن و جێبەجێکردنی پەیمان:**

﴿*واوفوا بعهد الله إذا عاهدتم*﴾ النحل/٩١.

واتە:(بە وەفا بن بەرامبەر بە بەڵێن وپەیمانی خوا گەر پەیمانتاندا).

**٣٣:- باوەڕبوون بە سوپاس ونەوازش کردنی نیعمەتە بێ ژمارەکانی خوا:**

﴿*وأما بنعمة ربك فحدث*﴾الضحی/١١.

واتە: (باسی بەهرە و نیعمەتەکانی پەروەردیگارت بکە).

**٣٤- باوەڕ بوون بە پاراستنی زوبان لە درۆ و غەیبەت و نەمیمە:**

﴿*یاأیها الذین آمنوا اتقوا الله و کونوا مع الصادقین*﴾التوبة/١١٩.

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن وپارێزگاری

بکەن و لەگەڵ ڕاست گۆیاندا بن).

**٣٥-باوەڕ بوون بە پاراستن و گەڕاندنەوەی ئەمانات:**

﴿*إن الله يأمركم أن تؤدوا الامانات إلى أهلها*﴾ النساء/٥٨.

واتە: (خوای گەورە فەرمانتان پێ دەکات بە گەڕاندنەوەی ئەمانەت بۆ خاوەنەکەی).

**٣٦-باوەڕ بوون بە کوشتنی نەفس(خەڵکی)بە بێ هۆ حەرامە:**

﴿*ومن يقتل مؤمنا متعمدا فجزاؤه جهنم خالدا فيها وغضب الله عليه*﴾النساء/٩٣

واتە:هەر کەسێك ئیمانداریك بە (عەمدەن) بکوژێ ئەوا سزاکەی دۆزەخە و بەهەتایی تیایدا دەمێنێتەوە و خواش غەزەب و خەشمی لێ دەگرێت.

**٣٧- باوەڕبوون بە خۆ پاراستن لە داوێن پیسی:**

﴿*والذين هم لفروجهم حافظون*﴾ المؤمنون/٥.

واتە: (باوەڕداران ئەوانەن کە دامێنی خۆیان بپارێزن).

**٣٨- باوەڕ بوون بە دەست بەسەراگرتنی ماڵی خەڵك و پێکەگرتن وبەرتیل وەرگرتن حەرامن:**

﴿ *ولا تأكلوا أموالكم بينكم بالباطل......* ﴾ البقرة/١٨٨.

واتە: (ئێوە ماڵی یەکتری مەخۆن بەبێ شەرعی).

**٣٩- باوەڕ بوون بە خۆ پاراستن لە خواردن و خواردنەوەی ئەو شتانەی کە حەرامن:**

﴿ *حرمت عليكم الميتة والدم ولحم الخنزيروما أهل لغير الله ...* ﴾ المائدة/٣.

واتە:(قەدەغە و حەرام کراوە لە سەرتان مرداربوو و خوێن و گۆشتی بەراز و ئەوەی لەکاتی سەربڕیندا ناوی غەیری خوای لێ دێت).

**٤٠- باوەڕبوون بە حەرامی لەبەرکردنی جل و بەرگی حەریر و خواردن وخواردنەوە لە قاپ و قاپاغی زێڕ و زیو:**

لحديث حذيفة(ﷺ): ﴿ *لا تلبسوا الحرير ولا الديباج ولا تشربوا في آنية الفضة والذهب، ولا تأكلوا في صحافها، فإنها لهم في الدنيا وهي لكم في الآخرة* ﴾ البخاري ومسلم.

واتە: (جل وبەرگی حەریر و ئاوریشم لەبەر مەکەن و لە قاپ و قاپاغی زێرو زیو مەخۆنەوە، وتیای مەخۆن، ئەمانە لە دونیادا بۆ بێباوەڕانە و لە ڕوژی دوایش بۆ ئێوەیە).

**٤١- باوەڕ بوون بە حەرام زانینی یاریگا و شوێنی ڕابواردن کە پێچەوانەی شەرعی خوان:**

﴿*قل ما عند الله خير من اللهو ومن التجارة*﴾ الجمعة/١١.

واتە: (ئەوەی لە لای خوا بە دەست دەکەوێ چاکترە و باشترە لە بیستنی گۆرانی بێ سوود و کڕین و فرۆشتن و سەودا کردن).

**٤٢- باوەڕ بوون بە پاشەکەوت کردن و دەست پێوەگرتن:**

﴿*ولا تجعل يدك مغلولة الـى عنقك ولا تبسطها كل البسط فتقعد ملوما محسورا*﴾ الإسراء/٢٩.

واتە: (دەستت کۆت مەکە بە گەردەنت وئەوەندە ڕەزیل و قرچۆك مەبە، ئەوەندەش دەست بڵاو مەبە هیچت بۆ نەمێنێ و تەنگاو ببی و ببی بە لومەکاری خەڵکی).

**٤٣-باوەڕ بوون بە واز هێنان لە دڵ ڕەشی و ڕق و قینەو نێرەیی(حەسودی):**

عن أنس ﷺقال: قال رسول الله (ﷺ): ﴿*لا تحاسدوا ولا تباغضوا ولا تقاطعوا وكونوا عباد الله إخوانا*﴾ رواه مسلم.

واتە: (حەسادەت بە یەك مەبەن، ڕقتان لە یەك نەبێت، پەیوەندیتان لەگەڵ یەكتری مەپچڕێنن، بەندەی خواو برای یەكتری بن).

**٤٤- باوەڕ بوون بە حەرام زانینی نامووسی خەڵك:**

*﴿إن الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين أمنوا لهم عذاب أليم في الدنيا والأخرة...﴾* النور/١٩.

واتە:(ئەو كەسانەی حەز دەكەن خراپەكاری و بەدڕەوشتی لە ناو ئیمانداراندا بڵاو ببێتەوە، ئەوانە لە دونیا و لە قیامەت سزایەكی بە ئەزیەت و ناخۆش وەردەگرن).

**٤٥- باوەڕ بوون بە دڵسۆزی كاركردن بۆ خوا و واز هێنان لە ڕیایی:**

*﴿فمن كان يرجوا لقاء ربه فليعمل عملا صالحا ولا يشرك بعبادة ربه أحدا﴾* الكهف/١١٠.

واتە: (هەر كەسێك دەیەوێ بگات بە بارەگای خوا با بە دڵسۆزی كردەوەی چاك ئەنجام بدات و لە پەرستنی خوای خۆی با هاوبەشی بۆ پەیدا نەكات).

واتە: (هەر نوێژێك ئەکەیت و هەر قوربانیەك ئەکەیت تەنها بۆ پەروەردیگارت بکە).

**٤٩- باوەڕ بوون بە گوێڕایەڵی کردنی برا گەورە و سەرپەرشتیار و ئەمیر:**

﴿*یاأیها الذین آمنوا أطیعوا الله وأطیعوا الرسول واولی الامر منکم*﴾النساء/٥٩.

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕ دارن گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) و فەرمانڕەوا و لێپرسراو و ئەمیرەکانتان بکەن).

**٥٠- باوەڕ بوون بە پیادە کردن و گرتنە بەری ڕێگای جەماعەت و ئەهلی زانست و شەرعی ئیسلام:**

﴿*واعتصموا بحبل الله جمیعا ولا تفرقوا*﴾ آل عمران/١٠٣.

واتە: (دەست بگرن بە دینی خوا و ئەوانەی بە خواتان دەگەیێنی وە لەیەك جیا مەبنەوە).

**٥١-باوەڕ بوون بە حوکم کردن لە نێوان خەڵکی بە دادپەروەری:**

**٤٦- باوەڕ بوون بە دڵخۆش بوون بە چاکە کـردن و دڵ نـاخۆش بوون بە خراپە کاری:**

هەروەکو لەو فەرمودەیەدا هاتووە کە (عمر بن الخطـاب) لـە پێغەمبـەری (ﷺ) بۆمان دەگێرێتەوە ﴿*ومـن سرته حسنته وساته سيئته فهو مؤمن*﴾ حديث صحيح.

واتـە:ئـەو کەسـانەی بـە کـردەوەی چـاك دڵيـان خـۆش دەبێـت، و بـە کردەوەی خراپ و نا هەموار دڵ گیر دەبن، ئەوانە بڕواردار و ئیماندارن.

**٤٧- باوەڕ بوون بە وەی کە چارەسەری هـەموو گۆنـاهێك. بە تەوبەکردن دەکرێت:**

﴿*ياايها الذين آمنوا توبوا الى الله توبة نصوحا*﴾التحريم/٨.

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕدارن تەوبە بکەن، پاشگەز ببنەوە لە گوناهەکانتان، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە پاکی و بە یەکجارەکی).

**٤٨- باوەڕ بوون بە قوربانی کردن لە کاتی جەژنی قوربان و حەج کردن و لە کاتی لە دایك بوونی منداڵ لە ڕێگای خوا:**

﴿*فصل لربك وانحر*﴾ الكوثر/٢.

﴿*وإذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل*﴾ النساء/٥٨.

واتە: (گەر حوکمرانیتان لە نێوان خەڵکی کرد فەرمان بە داد و یەکسانی بکەن و بە عەدالەت ئەنجامی بدەن).

**٥٢- باوەڕ بوون بە فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگە گرتن کردن لە خراپە:**

﴿*ولتكن منكم أمة يدعون إلى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر وأولئك هم المفلحون*﴾ آل عمران/١٠٤.

واتە: (با لە ئێوە گەلێك ومیللەتێك پێك بێت داوای چاکە بکەن و فەرمان بکەن بە چاکە و دورکەونەوە و واز لە خراپەکاری بهێنن، ئەمانەن ڕزگاریان دەبێ).

**٥٣-باوەڕ بوون بە یارمەتی دانی یەکتر لە سەر چاکە کردن:**

﴿*وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الإثم والعدوان*﴾المائدة/٢.

واتە: (کۆمەکی یەکتر بکەن لە سەر کار و کردەوەی چاك و خۆ پارێزن لەو شتانەی کە مایەی پەشیمانی و ناڕەزایی خوایە، و

کۆمەکی یەکتر مەکەن لە سەر گوناە وتاوان کردن).

**٥٤- باوەڕ بوون بە بوونی شەرم و شکۆ:**

﴿*فان الحیاء من الإیمان*﴾ متفق علیە.

واتە: (شەرم و شکۆ لە باوەڕوەیە).

**٥٥- باوەڕ بوون بە چاکە کردن لەگەڵ دایک وباوەک:-**

﴿*وبالوالدین إحسانا*﴾.البقرة/٨٣، النساء/٣٦، الأنعام/١٥١.

واتە:بەو پەڕی ڕێك وپێکیەوە لەگەڵ باوك و دایکتان چاکە بنوێنن.

**٥٦- باوەڕ بوون بە جێهێنانی سیلەی ڕەحم و سەردانی کردنی یەکتری:**

﴿*فهل عسیتم إن تولیتم أن تفسدوا في الأرض وتقطعوا أرحامکم أولئك الذین لعنهم الله فاصمهم واعمی ابصارهم*﴾ محمد/٢٣-٢٤.

واتە: (ئایا ئێوە دەتانەوێ لە سەر زەوی پشت بکەنە ئاینی ئیسلام و بەدکاری و خراپەکاری و ئاژاوە لە سەر زەوی بنێنەوە و سیلەی ڕەحم لە نێوانتان بپچڕێنن و خزامەیتی نەهێلن، ئا ئەوانەی کە ئەم کارە ئەنجام ئەدەن خوا نەفرەتی لێکردوون و کەڕ و کوێری کردوون بەرامبەر بەم هەق و هیدایەتە).

٥٧- باوەڕبوون بە ڕەوشتی جوان و ڕق بونەوە لە کرداری بەدخویی و نەرم نیانی و لێ بوردن بەرامبەر خەڵکی:

﴿*والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس والله يحب المحسنين*﴾آل عمران/١٣٤.

واتە: (ئەو کەسانەی ڕق و قینەی خۆیان دەخۆنەوە لە خەڵکی دەبورن، خواش پیاو چاکان و چاکە کارانی خۆش دەوێ).

٥٨- باوەڕ بوون بە چاکە کردن لەگەڵ کەنیزەکان:

﴿*واعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا وبالوالدين إحسانا وبذي القربى واليتامى والمساكين والجار ذي القربى والجار الجنب والصاحب بالجنب وابن السبيل وما ملكت ايمانكم*﴾ النساء/٣٦.

واتە: (خوا بپەرستن و هیچ شتێك مەكەن بە هاوبەشی وچاکە لەگەڵ دایك و باوکتان بکەن، و ئەوانەی خاوەن خزمایەتین ولەگەڵ هەتیوان و هەژار و بێ نەوایان و دراوسێ خزمەکان و دراوسێ بێگانەکان و هاورێ نیشتەجێیان (مەبەست حەلاڵ و هاوسەرە) و ئەو ڕێبوارانەی کە خەرجیان لێ براوە و ئەو کەنیزانەی کە کەوتونەتە دەستتان کراوە بە مولکتان).

**٥٩- باوەڕ بوون بە مافی خاوەن بەندەکان لە سەر بەندەکانیان:**

لحديث عبدالله بن عمر (ﷺ) أن رسول الله (ﷺ) قال: ﴿*إن العبد إذا نصح لسيده وأحسن عبادة ربه فله أجره مرتين*﴾ متفق عليه.

واتە: (گەر هاتوو بەندە گوێ ڕایەڵی خاوەنەکەی بوو و خوا پەرستیشی بە تەواوی ئەنجام دا، ئەوا پاداشتەکەی دوو ئەوەندە دەبێت).

**٦٠- باوەڕ بوون بە مافی ماڵ و منداڵ و خێزان لە سەر بەخێوکەرەکەی:**

واتە:- هەڵسانی پیاو بە پەروەردەکردنی منداڵ و خێزانەکەی و فێرکردنی هەموو ڕێبازەکانی ئایینی پیرۆز.

﴿***يا أيها الذين آمنوا قوا أنفسكم وأهليكم نارا وقودها الناس والحجارة.....***﴾ التحريم/٦.

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕدارن خۆتان و ماڵ ومنداڵتان بپارێزن لەو ئاگرەی سوتەمەنیەکەی بریتی لە مرۆڤ و بەرد).

**٦١- باوەڕ بوون بە خۆ نزیک کردنەوە لە ئەهلی ئاینی ئیسلام و خۆش ویستنیان و گفتوگۆ کردن لەگەڵیان و سڵاو کردن لێیان:**

لحديث أبي هريرة (ﷺ) في صحيح مسلم، قال النبي (ﷺ): ﴿*والذي نفسي بيده لا تدخلون الجنة حتى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتى تحابوا، او لا ادلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم*﴾.

واتە: (سوێند بەو خوایەی کە گیانی منی بە دەستە، ئێوە ناچنە بەهشت تاوەکو بڕوا نەهێنن، دە بڕواتان تەواو نابێت تا وەکو یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکی واتان پێ بڵێم کەوا بە هۆیەوە خۆشەویستی لە نێوانتان زۆر ببێت؟! سلاو و (سەلام) لە نێوان یەکتری بلاوبکەنەوە).

**٦٢- باوەڕ بوون بە وەڵام دانەوەی سەلام:**

﴿*وإذا حييتم بتحية فحيوا باحسن منها او ردوها*﴾النساء/ ٨٦.

واتە: (گەر سەلامتان لێکرا، ئێوەش وەلامی بدەنەوە بە شیرین تر و چاکتر).

**٦٣- باوەڕ بوون بە سەردان کردنی نەخۆش:**

لحديث البراء بن عازب (رضي الله عنه) قال: ﴿أمرنا رسول الله (ﷺ) بسبع، .....وامرنا بعيادة المريض﴾ رواه بخاري ومسلم.

واتە: (پێغەمبەر فەرمانی پێ کردوین بە حەوت شت یەك لەوانە (سەردانی نەخۆش بکەین).

**٦٤- باوەڕ بوون بە نوێژ کردن لە سەر مردووی موسولمانان:**

لحديث ثوبان في صحيح مسلم ﴿من صلى على جنازة فله قيراط ومن شهد دفنها فله قيراطان، القيراط مثل أحد﴾.

واتە: (هەر کەسێك نوێژ لە سەر مردوویەك بکات ئەوا قیراتێکی بۆ هەیە، گەر بەشداریش لە ناشتنی بکات ئەوا دوو قیراتی پێ ئەدرێت، هەر قیراتێکیش بە قەد کێوی ئوحدە).

**٦٥- باوەڕ بوون بە وەڵام دانەوەی ئەو کەسەی دەیپژمێ پێدەکژێ:**

لحديث أبي بردة في صحيح مسلم عن أبي موسى الأشعري ﴿إذا عطس أحدكم فحمد الله فشمتوه وإذا لم يحمد الله فلا تشمتوه﴾.

واتە: (ئەگەر کەسێك پشمی و سوپاسی خوای کرد ووتی:(الحمد لله) ، دوعای ڕەحمەتی بۆ بکەن و بڵێن: (يرحمك الله)، و ئەگەر

سوپاسی خوای نەکرد وای پێ مەڵێن).

**٦٦- باوەڕ بوون بە دوور کەوتنەوە لە بێ بڕوایان و ڕق لێ بوونەوەیان:**

﴿یا أیها النبي جاهد الکفار والمنافقین واغلظ علیهم﴾التوبة/٧٣.

واتە: (ئەی پێغەمبەری خوا تێبکۆشە لە دژی بێ بڕواکان و دوو ڕووەکان، بەربەرەکانیان بکەو توند و تیژ بە لەگەڵیانا ).

**٦٧- باوەڕبوون بە ڕێزگرتنی دراوسێ:**

﴿من کان یؤمن بالله والیوم الاخر فلیکرم جاره﴾ متفق علیه.

واتە: (هەر کەسێ باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە دراوسێکەی بگرێ).

**٦٨- باوەڕ بوون بە ڕێز گرتن لە میوان:**

لحدیث أبي شریح العدوي قال: قال رسول الله(ﷺ): ﴿من کان یؤمن بالله والیوم الاخر فلیکرم ضیفه﴾ متفق علیه.

واتە: (هەر کەسێ باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە میوان بگرێت).

**٦٩- باوەڕ بوون بە داپۆشینی عەیب وکەموکوڕی خەڵک:**

لحديث سالم بن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما عن أبيه: قال النبي (ﷺ): ﴿*من ستر مسلما ستره الله يوم القيامة*﴾ رواه مسلم.

واتە: (هەر کەسێ عەیب و عارو کەم و کوڕی موسوڵمانێك داپۆشێ لە دونیادا، ئەوا خواش کەم وکوڕی ئەو دادەپۆشێ لە پاشە ڕۆژا).

**٧٠- باوەڕ بوون بە نارام گرتن لەسەر کارەسانەکاندا:**

﴿*يا أيها الذين آمنوا استعينوا بالصبر والصلاة إن الله مع الصابرين*﴾البقرة/١٥٣.

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە داوای کۆمەکی بکەن بە خۆگری و نوێژکردن بە ڕاستی خوا لەگەڵ خۆگران دایە).

**٧١- باوەڕ بوون بە کەم زانینی دونیا و گوێ پێنەدانی و دەست کردن بە خوا پەرستی و خەلوە کردن:**

﴿*فهل ينظرون إلا الساعة أن تأتيهم بغتة فقد جاء أشراطها*﴾ محمد/١٨.

*واتە:ئایا ئەو دوو ڕووانە چاودڕوانی چی تر ئەکەن جگە لە ڕۆژی دوایی کە کت و پڕ دێت و یەخەیان دەگرێت،کە نیشانەکانی هاتووە.*

**٧٢- باوەڕبوون بە هەبوونی غیرەت و وازهێنان لە بێ غیرەتی:**

عن أبي سعيد الخدري عن النبي(ﷺ) أنه قال: ﴿*الغيرة من الايمان وان المذاء من النفاق*﴾ متفق عليه.

واتە: (غیرەت هەڵسان لە باوەڕ دایە، وە کۆکردنەوەی ژن وپیاو، یان بە یەکتر ڕەوان کردنیان لە دوو ڕوویی دایە).

**٧٣- باوەڕ بوون بە دوور کەوتنەوە و وازهێنان لە زۆر بلێیی(اللغو ) :**

﴿*والذين هم عن اللغو معرضون*﴾المؤمنون/٣.

واتە: (باوەڕ داران ئەوانەن کە خۆیان دەپارێزن و دوور دەکەونەوە لە لەغوە کردن و زۆر بلێیی و قسەی پڕ وپووچ و بێ سوود).

**٧٤- باوەڕ بوون بە بەخشندەیی ودەست لە ماڵ بوونەوەو چاکە کردن و دڵ فراوانی:**

﴿*ومن يوق شح نفسه فاولئك هم المفلحون*﴾ الحشر/٩.

واتە:هەر کەسێك خۆی لە ڕەزیلی بپارێزێ ئەوا ڕزگاری دەبێ لە ئاگر

**٧٥-باوەڕبوون بە بەزەیی هاتنەوە بە بچووك و ڕێزگرتن لە گەورە:**

لحديث النبي(ﷺ) ﴿*من لم يرحم صغيرنا ولم يعرف حق كبيرنا*

***فليس منا*** ﴾ مسلم.

واتە: (ئەوەی بەزەیی بە بچووکەکان نەیەتەوەو ڕێزیش لە گەورەکان نەگرێت، ئەوا لە ئێمە نیە).

**٧٦- باوەڕ بوون بە چاك كردنەوەی نێوانی خەڵك:**

﴿***إنما المؤمنون إخوة فاصلحوا بين أخويكم...***﴾الحجرات/١٠.

واتە:باوەڕداران برای یکترن،بۆیە چاك سازی(أصلاح)ی نێوانیان بکەن.

**٧٧- باوەڕ بوون بە وەی کە چیت بۆ خۆت پێ خۆشە دەبی ئەوەشت بۆ براکەت پێ خۆش بێت:**

لحديث أنس في صحيح البخاري: قال النبي(ﷺ): ﴿***لايؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه***﴾.

واتە: (باوەڕی هیچ کەسێکتان تەواو نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێ خۆش نەبێت).

## ﴿كـــۆتـــايی﴾

وصلى الله وسلم على نبينا محمد، وعلى آله وصحبه أجمعين

*** وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين ***